پێشەکی

بەناوی حەق..

ئامانجم لە کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی یاریکردن و یاساکانی شەترەنج و وەرگێڕانیان بۆ زمانی کوردی بەپێی توانای خۆم، تەنیا بەردەست خستنی زانیاریەکانە بۆ هاوزمانانی خۆم چونکە خۆم یەکێک بووم زۆر ویڵبووم بەدوای زانیاریەکان بەڵام بەداخەوە هیچ سەرچاوەیەکی کوردیم نەدۆزییەوە (گەر هەشبێت من نەمتوانی بیدۆزمەوە)، لەبەر ئەوە هەستام بە کۆکردنەوەی زانیاریەکان و وەرگێرانیان و بێبەرامبەر بلاوکردنەوەی تا هەر تاکێک خولیای شەترەنجی هەبوو بە ئاسانترین شێوە دەستی بکەوێت، من ئەم کتێبە چاپ ناکەم تەنیا بەشێوەی کتێبی ئەلیکترۆنی بلاوی دەکەمەوە بۆ تەواوی هاوزمانانم. بێگومانم کە هەڵەو کەمووکورتی دەبێت، من چاوەڕوانی ڕەخنە و ڕاستکردنەوەی شارەزایان و یاریزانانی کوردم بەتایبەت لە ناوهێنان لە کردارەکان.

دەمەوێ لێرەدا ئاماژە بە ناوی بەهێزترین پارچەی شەترەنج بکەم کە لە ولاتانی ڕۆژهەلات بە (وەزیر) ناونراوە بەلام من بە (شاژن) ناوم هێناوە وە ئەمە هیچ کێشەیەک بۆ تۆی خوێنەر و فێرخواز دروستناکات.

هەرلێرەدا دەمەوێت ئاماژە بە سەرچاوەکان بکەم. من زۆر سودم لە ماڵپەری (chess.com) وەرگرتووە کەدەتوانم بڵێم 99% ی زانیارەکانم لەوێوە وەرگتووە، وە هەروەها سودم لە ویکیپیدیای ئینگلزی بینیوە، هەروەها پەڕەیەکی فەیسبوکی کوردی..

لەکۆتایدا دەمەوێ سوپاسی خودابکەم کە توانیم کۆکردنەوەیەک بکەم بەو هیوایەی سودێکی هەبێت و خزمەتێک بیت (بەو هیوایەی هێرشم نەکرێتە سەر بە بیانوی ئەوەی حەرامە و بۆ موسڵمان گونجاو نییە، بەبڕوای من هیچ ئیشکالێکی تێدانییە گەر قوماری پێوەنەکرێت هەڵبەتە پرسیاریشم کردووە و وەڵامم وەرگرتووەتەوە کە بەدەر لەوەی قوماری پێنەکرێت و لە ژیانت نەکات حەرام نییە).

سوپاسی بێپایانم بۆ خێزانەکەم کە بواری ئەوەی پێداوم کاتەکانی لێوەربگرمەوە و سەرقاڵی وەرگێڕان و نوسینی ئەم زانیاریانە بم، وە یارمەتیدەرم بووە و پاڵپشتم بووە.

# پێڕست

هەرگیز درەنگ نییە بۆ فێربوونی چۆنیەتی کردنی یاری شەترەنج- بەربڵاوترین یاری لەجیهاندا!

فێربوونی یاساکانی شەترەنج ئاسانە:

1. دامەزراندنی تەختەی شەترەنج
2. فێربوونی جوڵەی پارچەکان
3. فێربوونی یاسا تایبەتەکان
4. فێربوونی کێ یەکەم جوڵەدەکات
5. وردبونەوە لە یاساکانی چۆن براوەبی
6. خوێندنی بنەماکانی پلاندانان
7. ڕاهێنان کردن و یاریکردنی زۆرترین یاری

## هەنگاوی یەکەم: چۆنیەتی دامەزراندنی تەختەی شەترەنج

لەسەرەتای یاری شەترەنجدا تەختەی شەترەنج وادادەنرێت کە هەر یاریزانێک خانەی ڕەنگی سپی(یان درەوشاوە) بکەوێتە گۆشەی خوارەوەی دەستە راستی.




دواتر ڕێکخستنی پارچەکان هەموو کاتێک بەهەمان شێوە دەبێت. خانەکانی دووەم ڕیزی ئاسۆی سەربازەکان دەیانگرن. لە ڕیزی یەکەمی ئاسۆیشدا لە گۆشەکاندا قەڵاکان، دواتر لەتەنیشت هەریەکەیان ئەسپەکان و دواتر فیلەکان و لەکۆتایشدا شاژن، کە هەمیشە دەکەوێتە سەر ئەوخانەیەی لەرەنگی خۆیەتی (شاژنی سپی لەسەر خانەی سپی و شاژ نی ڕەش لەسەر خانەی ڕەش)، وە پاشاش لەسەر ئەوخانەیە کە ماوەتەوە.



لەم بەستەرەوە تاقیکردنەوە بە سەرنجت بکە لەسەر تەختەی شەترەنج

## هەنگاوی دووەم: پارچەکانی شەتڕەنج چۆن دەجولێن

هەریەک لە شەش جۆر پارچەکان جوڵەی جیاوازیان هەیە. پارچەکان ناتوانن بەسەریەکتردا بازدەن (جگە لە ئەسپ کە دەتوانێت بەسەر پارچەکاندا بازدات)، وە هەرگیز ناتوانن بجوڵێن بۆ سەرخانەیەک کە یەکێک لە پارچەکانی خۆی خاوەنیەتی. هەرچەندە دەتوانن بجوڵێندرێن بۆ گرتنی شوێنێک کە پارچەی بەرامبەری تێدایە ئەمەش دەبێتە لەناوبردنی پارچەی بەرامبەر(خواردن). پارچەکان بەگشتی دەچنە شوێنی پارچەی تر لەکاتێکدا بتوانێت پارچەی بەرامبەری لەناوببات (بە داگیرکردنی خانەکەی و لابردنی پارچەکە لەسەر تەختەی شەتڕەنجەکە و دانانی پارچەکەی خۆی لەجێگەی)، هەموو پارچەکان بەیەکەوە بەرگری دەکەن لەپارچەکانیان لە باری لەناوچوون(خواردن) یان کۆنترۆڵ کردنی خانە گرنگەکان لە یاریەکەدا.

### چۆنیەتی جوڵاندنی پاشا

پاشا گرنگترین پارچەیە، بەڵام لە لاوازترینەکانە. پاشا تەنیا دەتوانێت یەک خانە بجولێت بەهەر ئاراستەیەکدابێت-سەرەوە، خوارەوە، لایەکان، و بەلاریش.



پاشا هەرگیز ناتوانێت بجوڵێت و خۆی بخاتە ناو کش(چێک)ەوە،(لەبەرئەوەی دەخورێت). کاتێک پاشا هێرشی دەکرێتە سەر لەلایەن پارجەکانی ترەوە بەمە دەوترێت "کش"(چێک).

هەرگیز پاشایەکان ناتوانن ڕاستەوخۆ کش لەیەکتری بکەن وە هەمیشە دەبێت خانەیەک لەیەکتر دوربن واتە هیچکات ناتوانن دوو لەپاشاکان بچنە ناو دوخانەی هاوسێی یەکتر.

## چۆنیەتی جوڵاندنی شاژن

شاژن بەهێزترین پارچەیە. دەتوانی بەهەموو ئاڕاستە ڕێکەکاندا بڕوات-پێشەوە، پشتەوە، لایەکان و لاریەکانیش- تا دورترین شوێن کە لەتوانایداهەبێت وە ئەو ناتوانێت بجوڵێت بەسەر هیچکام لەپارچەکاندا.



وەک هەموو پارچەکانی تر، کاتێک شاژن پارچەیەکی لەناوبرد(خوارد) جوڵەکەی لەوێدا کۆتایی دێت.

لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات ئاسایی شاژن بە (وەزیر) ناودەبرێت.

## چۆنیەتی جوڵاندنی قەڵا

قەڵا دەتوانێت بجوڵێت تا ئەوەندەی بتوانێت، بەڵام تەنیا بۆ پێشەوە و پشتەوە و لایەکان.



قەڵاکان پارچەی تایبەت و بەهێزن کاتێک پارێزگاری لەیەکدەکەن و بەیەکەوە کاردەکەن!

## چۆنیەتی جوڵاندنی فیل

فیل دەتوانێت بجوڵێت تا ئەوەندەی بتوانێت، بەڵام تەنیا بەلاری(شێوەی X). هەر فیلێک لەسەر ڕەنگێک وەستاوە (سپی یان ڕەش) وە هەمیشە لەسەر ڕەنگی خۆی دەمێنێتەوە.



فیل هاوشێوەوەی هەموو پارچەکانی تر ناتوانێت بازدات بەسەر پارچەیەکی تردا، (جگە لە ئەسپ کە تواناى بازدانی هەیە بەسەر پارچەکاندا).




فیلەکان بەیەکەوە زۆر باش کاردەکەن لەبەر ئەوەی هەریەکەیان لاوازی ئەوی تر دادەپۆشێت.

## چۆنیەتی جولآندنی ئەسپ

جوڵەی ئەسپ زۆر جیاوازە لە جوڵەی پارچەکانی تر- دوو خانە دەڕوات بە یەک ئاڕاستەدا و دواتر یەک خانەی تر بە گۆشەی 90 پلە، ڕێک هاوشێوەی پیتی 'L'ی ئینگلیزی.



ئەسپ تاکە پارچەیە کە دەتوانێت بەسەر پارچەکانیتردا بازدات.



## چۆنیەتی جوڵاندنی سەرباز

سەربازەکان نا ئاسایین لەبەرئەوەی جوڵە و لەناوبردن(خواردن)یان بەچەند ڕێیەکی جیاوازە: ئەوان بۆ پێشەوە دەجوڵێن بەڵام خواردنیان بە لاریە. سەربازەکان هەمووکات یەک خانە دەتوانن بچنە پێشەوە لە جوڵەیاندا، جگە لە جوڵەی یەکەمیان کە دەتوانن دوو خانەش بچنە پێشەوە.



سەربازەکان پارچەی زۆر بەهێزن کاتێک بەیەکەوە کاردەکەن، وە سەربازەکان بە ڕۆحی شەترەنج ناودەبرێن. سەرباز تاکە پارچەی شەترەنجە کە ناتوانێت بۆ دواوە بجوڵێت. یاسایەکی سەیرتری سەرباز ئەوە ناتوانێت بۆ پێشەوە هیچ پارچەیەک لەناوببات(بخوات) تەنیا دەتوانێت بە لاری پارچەکان بخوات.



هەروەک وتمان سەربازەکان تەنیا بەلاری دەتوانن پارچەکان بخۆن کاتێک لەپێشیانن. هەرگیز ناتوانێت بۆ دواوە بجوڵێت یان پارجەیەک لەپشت خۆی بخوات، ئەگەر هاتوو هەرپارچەیەک راستەوخۆ لەبەردەم سەربازێک بوو ئەوکات سەربازەکە ناتوانێت بجوڵێت و نە دەتوانێت بشیخوات(بەمە دەوترێت بلۆک)(قفڵبوون).

## هەنگاوی سێهەم: فێربوونی یاسا تایبەتییەکانی شەترەنج

چەند یاسایەکی تایبەت لە شەترەنجدا هەن کە یەکم جار بیرسایی(مەنتقی، لۆجیکی) دەرناکەون. ئەوانە بۆئەوە درووستکراون تا یاریەکە بەچێژتر و سەرسامکەرتر ببێت.

### چۆن سەرباز بەرەوپێشدەبەی(بەرزدەکەیەوە)

سەربازەکان توانایەکی تری جیاوازیان هەیە، ئەویش ئەوەیە کاتێک گەیشتن بە کۆتایی تەختەکە ئەوا دەتوانێت ببێت بەهەر پارچەیەکی تری شەترەنج(جگە لە پاشا) بەمە دەوترێت پلە بەرزبوونەوە(پرۆمۆشن). لەبەرزبوونەوەدا سەرباز دەتوانێت ببێت بە ( فیل یان قەڵا یان ئەسپ یاخود شاژن). وەک لەوێنەکاندا دیارە.



وەروەها ئاساییە لە یاریەکدا زیاتر لە شاژنێکت هەبێت، یاخود پارچەکانیتری وەک (قەڵا و ئەسپ و فیل) بەهۆی بەرزکردنەوەی سەربازەکانت. هەڵە تێگەیشتنێک هەیە کە گوایە سەرباز تەنیا دەتوانێت بگۆڕدرێتەوە لەکاتی بەرزبونەوەدا بەو پارچە بەهێزانەی خوراون، ئەمە ڕاست نییە، هەرکات سەرباز گەیشتە کۆتا خانەی بەرامبەری دەتوانێت بەرزببێتەوە بۆ هەرپارچەیەک جگە لە پاشا، وە تەنیا سەرباز دەتوانێت پلەی بەرزببێتەوە.

## چۆن تێپەڕاندن"en passant"دەکرێت

کۆتا یاسا دەربارەی سەرباز ناودەبرێت بە "تێپەڕاندن"، ئەگەر هاتوو سەربازێک دوو خانە چووە پێشەوە لە یەکەم جوڵەیدا، وە بەدانانی لەتەنیشتی سەربازی یاریزانی بەرامبەر ئەوکاتە سەربازی یاریزانی بەرامبەر (دەتوانێت بازبدات بۆ پشتی و سەربازەکەی تر دەخوات).


1


2


3

ئەم یاسا تایبەتە دەبێت ڕاستەوخۆ دوای یەکەم جوڵەی سەربازەکە بکرێت، گەرنا ئەم کردارە بۆ خواردنی سەربازەکە چیتر بەردەستنابێت.

"کرتە بکە بۆ زیاتر ئاشنابوون بەم یاسایە"

## چۆن ماڵكردن " Castle " دەكرێت

یەكێک لە یاسا تایبەتیەكانی تری شەترەنج پێی دەوترێت "ماڵكردن". ئەم جوڵەیە ڕێتپێدەدات دوو شتی زۆر گرنگ بكەی بە یەک جوڵە: بردنی پاشات بۆ شوێنێكی پارێزراو، وە دەرهێنانی قەلآت لە گۆشە و هێنانی بۆ ناو یاری. كاتێ نۆبەی جوڵەی تۆ بوو دەتوانی پاشات دوو خانە ببەی بۆ یەكێک لە لایەكان و دواتر قەلآ بجوڵێنی لەگۆشەی ئەو لایەی پاشات بۆ جولآند ڕێک بۆ تەنیشتی پاشا لە لایەكەیتر.(سەیری نمونەكەی خوارەوە بكە.) لەهەمانكاتدا بۆ ماڵكردن دەبێت ئەم مەرجانە هەبێت.

- دەبێت ماڵكردن ببێتە یەكەم جوڵەی پاشا (واتە پاشا نەجولآبێت پێشتر)
- دەبێت ماڵكردن ببێتە یەكەم جوڵەی قەلآ (واتە قەلآ نەجولآبێت پێشتر)
- نابێت هیچ پارچەیەک لەنێوان پاشا و قەلآدا بونی هەبێت.
- پاشا نابێت لە كش-دابێت یان بەسەر كش-دابروات (نابێت بەسەرخانەیەكدا بڕوات كە هەڕەشەی لەسەربێت لەلایەن پەرچەیەک لە پارچەكانی بەرامبەرەكەی).


1.


2.

لەم وێنانەی خوارەوە ناتوانرێت ماڵکردن بکرێت.



1.ماڵکردن نابێت کش لە پاشا کراوە.



2.ماڵکردن نابێت خانەکان هەڕەشەیان لەسەرە.



3.ماڵکردن نابێت پارچە هەیە لەنێوانیان

بیرمان نەچێت کاتێک پاشا جوڵا دواتر ناتوانێت ماڵکردن بکات، یاخود گەر پاشا نەجوڵابوو قەڵا جوڵابوو لەهەمان کاتدا ناتوانین ماڵکردن لەگەڵ ئەو قەڵایە بکەین کە جوڵاوە.

سەرنجبدە کاتێک ماڵکردن بەو ئاراستەیەدا دەکرێت کە پاشا نزیکترە لە لای تەختەکە بەمە دەوترێت "ماڵکردن بەلای پاشادا". وە ماڵکردن بە لایەکەی تردا لای شاژن پێی دەوترێت "ماڵکردن بەلای شاژندا".
بەبێ گوێدانە ئەوەی ماڵکردن بەکام لایەدایە پاشا تەنیا دوو خانە دەجوڵێت لەکاتی ماڵکردن.

## هەنگاوی چوارەم: دیاریکردنی کێ یەکەم جوڵە دەکات

ئەو یاریزانەی کە پارچە سپیەکانی پێیە هەمیشە یەکەم جوڵەدەکات. بۆ ئەو مەبەستە بەگشتی یاریزانەکان بڕیاردەدەن کێ دەبێت بە پارچەی سپی بە چانس و بەخت جا بە هەڵدانی دراوێکی ئاسن یاخود شاردنەوەی سەربازێک لەدەستی یاریزانێک و ئەویتر بزانێت لە کام دەستی دایە یاخود بە شاردنەوەی سەربازێک لەدەستی یاریزانێک و ئەویتر بزانێت سەربازەکە چڕەنگێکە لەدەستی یاریزانی بەرامبەری. دواتر سپی یەکەم جوڵەی دەکات بەدوای ئەودا ڕەش جوڵەی خۆی دەکات، دواتر دوبارە سپی، دواتر ڕەش بەمشێوەیە تا یاریەکە بەکۆتادەگات. گەربتوانی یەکەم جوڵە بکەی کەمێک باشترە لەبەر ئەوەی یاریزانی سپی دەتوانێت ڕاستەوخۆ دەست بە هێرشبردن بکات.

## هەنگاوی پێنجەم: پێداچوونەوەی یاساکان بۆ چۆنیەتی بردنەوەی یاری شەترەنج

لێرە چەند ڕێگایەک هەیە بۆ کۆتایی هێنان بە یاری شەترەنج: بە کش مات(کش و مردن)، یان یەکسانبوون، یان وازهێنان، یان لەدەستدانی کات...

### چۆن کش مات(کش و مردن) دەبێت لە شەترەنج

ئامانجی یاریەکە کش و مات کردنی پاشای بەرامبەرتە. ئەمە کاتێک ڕوودەدات کاتێک پاشا لەناو خانەی کش دابێت و نەتوانێت دەربازیببێت لە کش.

کش واتە ئاگاداربە پاشا لەمەترسیدایە. وەک ئەم نمونەیەی خوارەوە



دەبینین فیلی یاریزانی سپی لە خانەی f6 کشی لە پاشای ڕەش کردووە،( لەم بارەدا پاشای ڕەش دەبێت هەڵبێت). وە ناونانی ئەم کردارە بەم شێوەیە دەنوسرێت لە "نۆتەیشندا" +Bf6

**سێ ڕێگا هەیە کە پاشا دەتوانێت دەربازی ببێت لە کش:**

- هەڵهاتن لەو خانەیە (ناتوانێت ماڵکردن بکات!)
- بلۆک کردن(بەربەست خستنە ڕێگا)ی کشەکە بە پارچەیەکی تر
- خواردنی ئەو پارچەیەی هەڕەشەی لە پاشاکردووە.

سەرنجی ئەم نمونانەی خوارەوە بدەن کە چۆن پاشا خۆی دەربازدەکات لە کش.



لەم بارەدا دەبینین قەڵای ڕەش لە خانەی c1 کشی لە پاشای سپی کردووە کە لەخانەی g1 دایە، "بزانە کاتێک پاشا کش (هەڕەشە)ی لەسەرە تۆ ناتوانیت هیچ جوڵەیەک بکەی بەدەر لەوەی پاشا دەرباز بکەی لە کش."بۆ ئەوەی پاشا بپارێزین پێویستە دەربازببێت لە کش، پاشادەتوانێت هەڵێت بۆ خانەی f2. وەک لە وێنەی خوارەوەدا دیارە.



ڕێگایەکیتر بۆ دەربازبوون لە کش بلۆک کردن(بەربەست خستنە ڕێگا)ی کشەکە بە پارچەیەکی تر، وەک ئەم نمونەیەی خوارەوە.



سەرنج بدە شاژنی ڕەش لە خانەی g7 کشی لە پاشای سپی کردووە کە لەخانەی g1 دایە، کە بەم شێوەیە دەنوسرێت لە نۆتەیشندا +Qg7 . لێرەدا دوو ڕێگا هەیە بۆ دەربازبوون لە کش بەڵام ئێمە ڕێگای بلۆک کردن دەگرینە بەر، لەبەر ئەوە دەبێت قەڵای سپی کە لەخانەی f2 دایە بجوڵێنین بۆ خانەی g2 تاوەکوو کش-ەکە بلۆک بکەین، سەرنج بدەنە وێنەی خوارەوە کە کردارەکەمان کردووە.



کۆتا دانەی دەربازبوون لە کش کە باشترینیانە ئەویش خواردنی ئەو پارچەیەی هەڕەشەی لە پاشا کردووە، سەرنجی ئەم نمونەیە بدەن



دەبینین شاژنی سپی لە خانەی h8 کشی لە پاشای ڕەش کردووە کە لەخانەی f8 دایە، لەم بارەدا دوو ڕێگای دەربازبوونمان هەیە یان هەڵبێین(کە بیرۆکەیەکی زۆر خراپە)، یان بە ئەسپی ڕەش کە لە خانەی g6 دایە شاژنی سپی لەناوببەین(باشترین پێشنیارە). ئێمە ڕێگای دووەم دەگرینە بەر سەیری وێنەی خوارەوە بکە.



ئەگەر هاتوو پاشا نەیتوانی دەربازببێت لە کش-مات یاریەکە کۆتایی دێت. ئاسایی پاشا ناخورێت یان لانابرێت لەسەر تەختی شەترەنجەکە، بە سادەیی ڕادەگەیەنرێت کە یاریەکە کۆتایی هاتووە.

گرنگ نییە چەند پارچەت ماوە بە پلانی بەهێز هێشتا دەتوانی براوەبی سەرنج بدەنە ئەم وێنەیەی خوارەوە کە قەڵای سپی لەخانەی f8 دا کش-ماتی پاشای ڕەشی کردووە و هیچ ڕێگایەک نییە تا ڕەش خۆی دەرباز بکات لە کش و بەمەش یاریەکە کۆتایی دێت.



کش-مات دەکرێت ڕووبدات لەقۆناغەکانی سەرەتادا ئەگەر هاتو یەکیک لە یاریزانەکان بە وریایەوە یارینەکرد. لەخواروە نموونەیەک دەبینی کە کش-مات ڕوودەدات تەنیا بە دوو جوڵە.


1.f2


2.e5


3.g4


4.Qh4#

سەرنجبدە پاشای سپی بەهیچ ڕێگایەک ناتوانێت خۆی دەربازبکات لە هەڕەشەکە بەمەش یاریەکە بەکۆتا گەیشت تەنیا بە دوو جوڵە.

کرتە لەم بەستەرەبکە بۆ ئاشنا بوون بەو هەڵانەی بەزووترین کات توشی کش-مات دەبی.

## چۆن یەکسان بوون ڕوودەدات لە یاری شەترەنجدا

جاری واهەیە یاری شەترەنج بە بردنەوە کۆتایی نایەت، بەڵکو بە یەکسانبوون کۆتایی دێت.
پێنج هۆکار هەیە بۆ کۆتایهاتنی یاری بە یەکسانبوون:

1. جێگایەک کە بگاتبە "ستەیلمەیت" کاتێک یەکێک لە یاریزانەکان نۆبەیەتی بۆ جوڵان، بەڵام پاشاکەی لە کش دانییە و هێشتاش هیچ جوڵەیەکی یاسایی نییە:



سەرنچ بدەن ئێستا نۆبەی جوڵەی ڕەشە، بەڵام پاشای ڕەش هیچ جوڵەیەکی یاسایی نییە، لەم بارەدا یاریەکە بە یەکسان بوون کۆتایی دێت بە ستەیلمەیت.

2. یاریزانەکان هەردووکیان ڕازیبن بە یەکسانبوون و کۆتای بە یاریکردن بهێنن.
3. کاتێک پارچەی پێویست نەمێنێت لەسەر تەختەکە بۆ ئەنجامدانی کش-مات (بەنمونە: پاشایەک و فیلێک دژی پاشایەک) یاخود مانەوەی پاشاکان بەتەنیا.
4. یاریزانێک ڕایدەگەیەنیت کە یەکسانبوون ئەگەر لەهەمان شوێن بەبەردەوامی تا سێجار کش بکرێت دەتوانن ڕایبگەیەنن کە یەکسانبوون، یان دوای پێنج کشی دوبارەبوو خۆکارانە یەکسانبدەبن. وەک وێنەی خوارەوە کاتێ دوبارەبوونەوە ڕوودەدات کە لێرەدا لە سودی پارچەی سپی کۆتایی دێت.



5. پەنجا جوڵەی لەدوای یەک بەبێ جوڵەی سەرباز یاخود خواردنی هیچ پارچەیەک.

"ستەیلمەیت": هیچ هاوواتایەکی شایستەم نەدۆزیەوە بۆ ئەم ناوە، لەبەر ئەوە هەر ناوە ئینگلیزیەکەم بەکارهێنا.
ستەیلمەیت بە مانای یەکسانبوون دێت کاتێک تۆ هیچ جوڵەیەکی یاساییت نییە و پاشاشت لە کشدا نییە.

## هەنگاوی شەشەم: خوێندنی بنەماکانی پلاندانان

چوار شتی بنچینەیی هەیە کە دەبێت هەموو یاریزانێک بیزانێت.

### پاراستنی پاشا

پاشاکەت ببە بۆ گۆشەیەکی تەختەکە زۆربەی کات لەوێ سەلامەتە. ماڵکردن لە یادنەکەی. دەبێت هەمیشە ماڵکردن بکەی بەزووی ئەوەندەی دەتوانی. لەیادتبێت، ئەوە گرنگ نییە تۆ چەندە نزیکی لە کش-مات کردنی بەرامبەرەکەت چی ئەگەر پاشاکەت زووتر کش-ماتکرا!

### پارچەکانت دوورمەخەوە

بێخەم مەبە لە لەدەستدانی پارچەکانت! هەر پارچەیەک بەها و نرخی خۆی هەیە وە ناتوانی براوەبی بەبێ پارچەکانت بۆ کش-مات. چەند بەرنامە و ڕێکخستنێک هەیە کە زۆربەی یاریزانان بەکاریدەهێنن بۆ هێشتنەوەی ڕێگای پەیوەندی و بەهای هەریەک لە پارچەکان. بەهای پارچەکانی شەترەنج چەندە؟

- بەهای سەرباز 1.
- بەهای ئەسپ 3.
- بەهای فیل 3.
- بەهای قەڵا 5.
- بەهای شاژن 9.
- بەهای پاشا بێسنورە.

لە کۆتایی یاریەکەدا ئەم خاڵانە(پۆینت) مانای هیچ ناگەیەنن- ئەمە بەرنامە و سیستەمێکی سادەیە کە تۆ دەتوانی لەکاتی یاریکردندا بڕیاری پێبدەی. یارمەتیدەرتە لەکاتی خواردن یان ئاڵوگۆڕکردن یان جوڵەکانی تر.

### دەست بەسەرداگرتن(کۆنترۆڵکردن)ی ناوەڕاستی تەختەی شەترەنج

پێویستە هەوڵدەی بۆ دەستبەسەرداگرتنی ناوەندی تەختەکە بە پارچەکان و سەربازەکانت. ئەگەر تۆ کۆنترۆڵی ناوەڕاستتکرد، ژوری زیاترتدەبێت بۆ جوڵاندنی پارچەکانت و ئەرکی بەرامبەرت قورستر دەکەی بۆ دۆزینەوەی خانەیەکی باش بۆ پارچەکانی.

### هەموو پارچەکانت بەکاربهێنە

پارچەکانت هیچ شتێکی باش ناکەن کاتێ هەر لە ڕیزی یەکەم بمێننەوە لە پشتەوە. هەوڵدە هەموو پارچەکانت بەرەوپێش ببەی ئەوکاتە تۆ پارچەی زیاترت دەبێت بۆ هێرش بردنە سەر پاشای بەرامبەرت

## هەنگاوی حەوتەم: ڕاهێنان کردن و یاری کردنی زۆرترین یاری

باشترین شت کە بتوانی بیکەی بۆ باشتر بوونت لە شەترِەنج ئەوەیە زۆرترین یاری بکەی! گرنگ نییە یاری لەگەڵ کێ و لەکوێ دەکەی، لەماڵەوە لەگەڵ هاوڕێکانت یاخود لەگەڵ خێزانەکەت، یان یاریکردن لەسەر هێڵ، ئەوەی گرنگە زۆرترین یاری بکەی و خۆت بەرەو پێشببەی. ئەم ڕۆژانە ئاسانترە یاری شەترِەنج لە سەرهێڵ(ئۆنلاین) بدۆزیتەوە.

کرتە بکە لە بەستەرەکان بۆ داگرتنی باشترین یاری شەترِەنج لە جیهان بۆ مۆبایلە زیرەکەکانتان یاخود لە وێب بڕۆوسەری کۆمپیوتەرەکانتان.

داگرتن بۆ سیسیتەمی IOS کرتە بکە

داگرتن بۆ سیسیتەمی Android کرتە بکە

یاری کردن لە وێب بڕۆوسەری کۆمپیوتەرەکانتان

### چۆن یاریە هەمەجۆرەکانی شەترِەنج دەکەی

لەکاتێکدا زۆربەی خەڵکی یاری شەترِەنج بە یاساکانی ستاندەر دەکەن، هەندێ خەڵک هەیە ئارەزوو دەکات یاساکان بگۆڕێت بۆ یاریکردن. بەمە دەوترێت "چەشنەکانی شەترِەنج". هەر چەشنەو یاسای خۆی هەیە.

- **شەترِەنجی 960 (Chess960):** لەم چەشنەدا (فیشەر هەڕەمەکی)، شوێنە سەرەتاکانی پارچەکان بە هەڕەمەکی دادەنرێن، سەربازەکان ئاسایی لەشوێنی خۆیاندەبن واتە ڕیزی دووەمی ئاسۆیی، بەڵام پارچەکانیتر بە هەڕەمەکی دادەنرێن(مەرجە بۆ هەردوو یاریزانەکان پارچەکان وەکو یەک لەسەر تەختەی شەترِەنج دابنرێن).
- **پاشا لەسەر کێو (King Of The Hill):** لەم چەشنەدا، ئامانج ئەوەیە پاشاکەت ببەیتە ناوەڕاستی تەختەکە یان(لوتکەی کێوەکە).
- **ماڵە مێرو (Bughouse):** ئەم چەشنەی یارییە هاوەڵییە(دوانییە)(چوار یاریزان دەبن بە دوو تیم و دوو یاریزان دوو یاریزان دەبن بە تیمێک و لەسەر دوو تەختە یاریدەکەن، یاخوود دوو یاریزان لەسەر دوو تەختە یاریدەکەن)، کاتێک یەکێک لە یاریزانەکان پارچەیەک لە بەرامبەرەکەی دەخوات، ئەوکاتە بۆخۆی یاخود یاریزانی هاوەڵی دەتوانێت ئەو پارچەیە بەکاربهێنێ. بۆ نمونە: ئەگەر من یاری بە سپی بکەم و هاوەڵەکەم بە ڕەش یاریبکات، وە هاوەڵەکەم ئەسپی سپی لە بەرامبەرەکەی خوارد، لەسەرەی مندا من ئەسپێکم دەبێت کە دەتوانم لەسەر تەختەی یاری خۆم بیخەمە خانەیەکی بەتاڵ(گەر دوو ئەسپەکانی خۆم نەخورابن ئەوکاتە من دەبمە خاوەنی سێ ئەسپ). دەتوانم لە هەنگاوەکانی داهاتووش دایبنێم.

- **شێتخانە (Crazyhouse):** ئەمە هەژێنترین چەشنە، لەکاتێکدا ڕێگەت پێدەدات بە بەکارهێنانی ئەو پارچانەی لە بەرامبەرەکەتیان دەخۆی. بەم شێوەیە، ئەگەر من یاری بە سپی دەکەم و سەربازێکی ڕەش دەخۆم لە بەرامبەرەکەم، ئەو سەربازە ڕەشە دەگۆڕیت بۆ سەربازی سپی و دەتوانم بیخەمە سەر تەختەکە و دەبێت بە یەکێک لە ئەندامانی سوپاکەم. دەتوانم ئەمە لەهەر نۆبەیەکی داهاتووومدا بکەم.
- **سێ-کش (3-Check):** لەم چەشنەدا، هەر یاریزانێک زووتر سێ کش لە بەرامبەرەکەی بکات براوەیە.

## چۆن یاری بە یاسا وەرزشییە گشتیەکان دەکەی

زۆربەی وەرزشوانان پەیڕەوەی چەند یاسایەکی باوی هاوبەش دەکەن. ئەم یاسایانە زۆر گرنگنییە جێبەجێ بکرێن لە یاریکردنی ماڵەوە یان لەسەر هێڵ، بەڵام هەرچۆنێکبێت لەوانەیە بتەوێت ڕاهێنانیان لەسەربکەی.

- **دەستلێدان-جوڵە:** ئەگەر یاریزانێک دەستی لە پارچەیەکی خۆی دا دەبێت ئەو پارچەیە بجوڵێنێت گەر جوڵەکەی یاسایی بێت، ئەگەر یاریزان دەستی لە پارچەی بەرامبەریدا، دەبێت ئەو پارچەیە بخوات. گەر یاریزانێک ئارەزوویکرد دەست لە پارچەیەکبدات تەنیا بۆ ڕێکخستنی لەسەر تەختەکە پێویستە سەرەتا مەبەستەکەی بڵێت، ئاسایی بە وتنی "ڕێکخستن".
- **کاتژمێر و کات گر:** زۆربەی وەرزشوانان کات گر بەکاردەهێنن بۆ ڕێکخستنی کاتی بەسەربردویان لەیاریەکدا، نەک بۆ هەر جوڵەیەک. هەر یاریزانێک هەمان بڕە کاتیان هەیە بۆ بەکاربردن بۆ دەستپێکردنی یاریەکە و دەتوانن بڕیاربدەن چۆن کاتەکانیان بەسەردەبەن. کاتێک یاریزانێک جوڵەیەکی کرد دواتر دەست دەنێت بە دوگمەیەکدا یان لە نوێڵەکە دەدات بۆ بەکارخستنی کاتژمێری بەرامبەرەکەی. ئەگەر یاریزانێک کاتی تەواو بوو وە بەرامبەرەکەی وتی کات، ئەوکاتە ئەو یاریزانەی کاتەکەی تەواو بووە لە یاریەکە دەدۆڕێت (هەتا ئەگەر بەرامبەرەکەی پارچەی تەواویشی نەمابێت بۆ کش-مات، لەم بارەدا یەکسان دەبن).

لەوانەیە هەموو ئەم زانیاریانە کەمێک زۆربن بۆ تێگەیشتنی تۆ. لەبەر ئەوەیە ئێمە پرسیارە باوەکانمان داناوە کە زۆربەی کات ڕوودەدات لەوکەسانەی سەرەتا دەچنە ناو جیهانی شەترەنج. هیوادارین بەسوود بن بۆ تۆ!

**چۆن باشتربم لە شەترەنج**

زانینی یاساکان و بنەماکانی پلاندانان تەنیا سەرەتایەکە- زۆر زیاتر هەیە تا فێری ببی لە شەترەنج کە ناتوانی هەموویان فێرببی لەژیانتدا! بۆ بەرەوپێشچوونت پێویستە سێ شت بکەی:

1. **زۆرترین یاریکردنی شەترەنج-** تەنیا بەردەوامبە لە یاریکردن! ئەوەندەی دەتوانی یاریبکە. پێویستە لە هەر یاریەکەوە فێرببی – ئەوانەی لێیان براوەدەبی ئەوانەشی لێیان دەدۆڕێی.
2. **خوێندنی وانەکانی شەترەنج-** ئەگەر بەڕاستی دەتەوێت بە خێرایی فێرببی، پێویستە هەندێک وانەی سەرهێڵ(ئۆنلاین) ببینی. دەتوانی هەندێک لە وانە سەرهێڵیەکان لەم بەستەرەوە بدۆزیەوە chess.com/lessons
3. **دڵ خۆشبە-** بێ ورە و ساردمەبەوە کاتێک هەموو یاریەکانیشت بدۆڕێنی. هەموو کەس دەدۆڕێ- هەتا لە خولە جیهانیەکانیشدا. هەرچۆنێک بووە تۆ دڵخۆشبە و بەردەوامبە لە فێربوون لە یاریەکاندا و دواتر بۆ هەمیشە چێژ ببینە لە شەترەنج!

**باشترین جوڵەی سەرەتای یاری شەترەنج چییە؟**

لەکاتێکدا یەک پەسەندترین و باشترین جوڵە نییە لە شەترەنجدا، ئەوەی گرنگە کە کۆنترۆڵی ناوەڕاست بکەی ڕاستەوخۆ. ئاسایی ئەنجامی یاریکەران لە یاریدا یەکێک لە سەربازانی ناوەڕاست(ئەوانەی لەبەردەم پاشا و شاژن) دوو خانە بۆ پێشەوە دەبەن (1. d4) یان (1. e4) هەندێکی تر ئەمەیان لا پەسندە (1. c4) یان (1. Nf3). زۆربەی جوڵەکانیتر باشنین. بۆبی فیشەر باوەڕیوایە کە جوڵاندنی سەربازی بەردەم پاشا (1. e4) باشترین جوڵەیە.

**کام ڕەنگە دەست بە یاریکردن دەکات یەکەم جار؟**

هەردەم ئەو یاریزانەی پارچەی سپی پێیە یەکەمجار دەجوڵێت.

**سەرباز دەتوانێت بۆ دواوە بگەڕێتەوە؟**

سەرباز ناتوانێت بۆ دواوە بگەڕێتەوە. هەرچەندە، کاتێک سەرباز گەیشتە لایەکەی تری تەختەکە تۆ دەبێت پلەی بەرزبکەیەوە بۆ پارچەیەکی تر( وەک بوون بە شاژن). ئەوکات ئەو ڕێک وەک پارچەیە دەجولێت و دەتوانێت بۆ دواوە بجوڵێت.

**دەتوانی زیاتر لە پارچەیەک بجوڵێنی لەیەک کاتدا؟**

دەتوانی تەنیا یەک پارچە بجوڵێنی لە یەک کاتدا کاتێک نۆبەی تۆیە، لەیەک کاتدا نەبێت کاتێک تۆ ماڵکردن دەکەی، لەکاتی ماڵکردن تۆ پاشا و قەلا لەیەک جوڵەدا دەجولێنی.

**گرنگترین پارچەی شەترەنج کامەیە؟**

پاشا گرنگترین پارچەی شەترەنجە. ئەگەر پاشات لەدەستدا یاریەکەت لەدەستداوە. بەڵام شاژن بەهێزترین پارچەی شەترەنجە.

**کەی شەترەنج داهێنرا؟**

بنەڕەتی شەترەنج بەتەواوی ڕوون نییە. بەڵام زۆرینە باوەریان وایە شەترەنج وەک یاریەک سەرەتا لە هیند پەرەیسەندووە دووهەزار ساڵ لەمەوبەر، ئەو شەترەنجەی ئێستا ئێمە دەیناسین هی دەوروبەری سەدەی پازدەیە کاتێک خەڵکی ئەوروپا پێی ئاشنابوو.

**درێژترین یاری شەترەنج کامەیە لە مێژوودا؟**

درێژترین یاری شەترەنج لە پاڵەوانیەتیدا (لەسەر بنەمای جوڵە) کە تا ئێستا کرابێت لە نێوان نیکۆلیچ و ئەرسۆڤیچ بوو لە ساڵی 1989 لە بێلگرەید(سربیا). بە 269 جوڵە بۆ هەریەکێکیان.

## هێماکاری(نۆتەیشن) شەترۆنج چییە؟ (زمانی شەترۆنج)

هێماکاری شەترۆنج ڕێگایەکی زۆر گونجاو و ئاسانە بۆ هێشتنەوەی یاریەکانە، کە دەتوانی بەهۆیەوە دوبارەیان بکەیەوە و پێداچونەوە و خوێندنەوە بۆ تەکنیکەکان بکەی، لەهەڵەکان تێبگەی، یان بۆ هاوڕێکەتیان ڕونکەیەوە.

- **هێماکاری جەبری**

سادەترین و باوترین شێوەی هێماکاری شەترۆنج ناو دەبرێت بە هێماکاری جەبری. کە لکێنراو(نوسراو)ن لەسەر تەختەی شەترۆنجەکە بە پیت و ژمارە.




لەم وێنەیەی سەرەوە، پاشای سپی لەسەر خانەی c3 یە و پاشای ڕەش لەسەر خانەی h5.

لێرەدا ئەوە بزانن کە بە هەردوو یاریزانەکە یەک تەختەیان هەیە ئەمە واتای ئەوەیە هێماکاری بۆ هەردوو یاریزان یەک شێوازە (هەڵەیە وا بیربکەینەوە هەر یاریزانەو بەپێی ئاڕاستەی خۆی هێماکاری بکات، بەڵکوو هێماکاری جێگیر و نەگۆڕە و بۆ هەردوو یاریزان هەمان شێوەیە.

ئێمە 8 ڕیزی ئاسۆیی و 8 ڕیزی ستونییەمان هەیە، هەر ڕیزێکی ئاسۆیی بە ژمارەیەک ناونراوە لە 1 بۆ 8 وە هەر ڕیزێکی ستونی بە پیتێک ناونراوە لە a بۆ h. سەرنجی وێنەکەبدەن هیماکاری بەپێی یاریزانی پارچەی سپییە، ئەوکەسەی پارچەی سپی پێیە یەکەم ڕیزی ئاسۆیی بەردەمی ڕیزی 1 و کۆتا ڕیزی ئاسۆیی کە دەکەوێتە بەردەم یاریزانی بەرامبەری کە پارچەی ڕەشی پێیە ژمارە 8ە. وە ڕیزە ستوونیەکان بۆ ئەو یاریزانەی سپی پێیە لە چەپەوە بۆ ڕاست لە a دەست پیدەکاو بە h کۆتاییدێت، بۆ یاریزانی پارچە ڕەش لە ڕاستەوە بۆ چەپە پیتەکان بە ڕیزبەندی.

هەر خانەیەک بەپێی ئەم ڕیزە ئاسۆیی و ستونیانە ناودەنرێن بە پێی پیت و ژمارەکان، یەکەمجار پیتەکە و دواتر ژمارەکە دەنوسرێ یان ناودەنرێت بۆ هەر خانەیەک.
وەک e4 یان f6 .

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| a8 | b8 | c8 | d8 | e8 | f8 | g8 | h8 |
| a7 | b7 | c7 | d7 | e7 | f7 | g7 | h7 |
| a6 | b6 | c6 | d6 | e6 | f6 | g6 | h6 |
| a5 | b5 | c5 | d5 | e5 | f5 | g5 | h5 |
| a4 | b4 | c4 | d4 | e4 | f4 | g4 | h4 |
| a3 | b3 | c3 | d3 | e3 | f3 | g3 | h3 |
| a2 | b2 | c2 | d2 | e2 | f2 | g2 | h2 |
| a1 | b1 | c1 | d1 | e1 | f1 | g1 | h1 |

لە هێماکاری بۆ ناونانی پارچەکان تەنیا یەکەم پیتی کەپیتەڵی ناوی پارچەکان دەنوسرێت جگە لە سەرباز کە هیچ نانوسرێت لەکاتی جوڵەکەیدا تەنیا ناوی خانەکە و کردارەکەی دەنوسرێت (بەپێی ڕێککەوتن دەتوانن یەکەم پیتی سەربازیش بنوسرێت لە هێماکاریدا) بەم شێوەیە:

| | |
|---|---|
| K : King | پاشا |
| Q : Queen | شاژن |
| R : Rook | قەڵا |
| B : Bishop | فیل |
| N : Knight | ئەسپ |
| P : Pawn | سەرباز |

## هێما تایبەتیەکان

| | |
|---|---|
| خواردن(لەناوبردن) | x : captures |
| ماڵکردن بە لای پاشادا | 0-0 : kingside castle |
| ماڵکردن بەلای شاژندا | 0-0-0 : queenside castle |
| کش | + : check |
| کش-مات | # : checkmate |
| جوڵەیەکی باش | ! : good move |
| جوڵەیەکی خراپ(لاواز) | ? : poor move |
| پلە بەرزبونەوەی سەرباز | = : Pawn promotion |
| پێشنیاری یەکسانبوون | "(=)" |

کۆتایی یاری:

| | |
|---|---|
| سپی براوە بێت | **1–0** |
| ڕەش براوەبێت | **0–1** |
| یەکسانبوون | **½–½** |

**چۆن جوڵەکان دەنوسرێن**

بۆ نوسینی جوڵەکان، ناوی پارچەکە و ئەو خانەیە دەنوسین کە بۆی دەجوڵێنین. ئەگەر پارچەکە پارچەیەکی بەرامبەری خوارد هێمای (x) بۆ خواردن لە دوای ناونانی خانەکە دەنوسین.

بۆ نمونە سەرنجی ئەم یاریەبدەن بە وێنەوە:



هێماکاری بۆ جوڵەی هەردوو یاریزانەکە بەم شێوەیە دەبێت 1. Nc3 f5 ژمارە (.1) واتە جوڵەی یەکەم بۆ هەردوو یاریزان، Nc3 واتە پارچەی سپی ئەسپی جوڵاند بۆ خانەی c3، دواتر بۆشاییەک هەیە و نوسراوە f5 واتە پارچەی ڕەش سەربازی بردووە بۆ خانەی f5.



جوڵەی دووەم بۆ هەردوو یاریزان، 2. e4 fxe4 بەشی یەکەم ڕوونە بەشی دووەم کە جوڵەی پارچەی ڕەشە fxe4 واتە سەرباز خواردنێکی ئەنجامدا و لە خانەی e4 جێگیربوو.





جوڵەی سێیەم بۆ هەردوو یاریزان بریتیە لە 3. Nxe4 Nf6 ، بەشی یەکەم کە جوڵەی پارچەی سپییە واتە ئەسپ خواردنێکی ئەنجامدا و لە خانەی e4 جێگیربوو،(سەرنج بدەن ئاماژە بە پارچە خوراوەکە ناکرێت لە هێماکاریدا). وە بەشی دووەم رونە کە پارچەی ڕەش ئەسپی جوڵاندووە.





جوڵەی چوارەم بۆ هەردوو یاریزان بریتیە لە 4. Nxf6+ gxf6 ، سەرنج بدە یاریزانی سپی بە ئەسپ خواردنێکی ئەنجامداوە و جێگیربووە لە f6 و کش-یشی لە پاشای ڕەش کردووە، لەم بارەدا پێویستە پارچەی ڕەش خۆی دەرباز بکات لە کش وە بیرمان نەچێت باشترین ڕێگا بۆ دەربازبوون لە کش خواردنی ئەو پارچەیە کە بوەتە هەڕەشە لە پاشا، بۆیە لەبەشی دووەمی هێماکاریدا دەبینین پارچەی ڕەش هەڕەشەکەی لابردووە خواردنێکی ئەنجامداوە بەڵام سەرنج بدەن پارچەی ڕەش بە دوو سەرباز دەتوانێت خوردن ئەنجامبدات لەم بارەدا دەبێت ئاماژە بە خانەی ئەو پارچەیەبدەین کە کردارەکە دەکات جا یان بە (پیت یان ژمارە(بەڵام لێرەدا لەیەک ڕیزی ئاسۆین سەربازەکان بۆیە ژمارە بێسودە بەڵام ڕیزی ستونی جیاوازیان هەیە بۆیە پیت دەنوسرێت)) سەرنج بدەن

سەربازی ڕیزی ستونی g خواردنەکەی ئەنجامداوە کەواتە دەنوسرێت gxf6 (هەڵبەتە جوڵەیەکی خراپە).



سەرنجی جوڵەی پێنجەم بدەن، بەم شێوەیە لە هێماکاریدا نوسراوە 5. Qh5# دەبینین تەنیا یەک بەش نوسراوە و هێمای # لە کۆتاییدایە وە ئێمە دەزانین # واتە کش-مات، هەربۆیەشە تەنیا جوڵەی پارچەی سپی نوسراوە، پارچەی سپی شاژنی جولاندووە بۆ خانەی h5 و کشی لە پاشای ڕەش کردووە، وە ئێمە دەزانین کاتێک کش کرا پێویستە کش-ەکە هەڵبوەشێنینەوە یان بە ڕاکردن یان بە بەربەستخستنەبەردەم یاخود بە خواردنی پارچەکە، بەڵام لێرەدا هیچ ڕێگە چارەیەک نییە، لەبەر ئەوە دەبێت بە کش-مات و پارچەی ڕەش یاریەکەی لەدەستدا.

**خۆدورخستنەوە لە ناڕونی هێماکاری**

لە هەندێ بارداتەنیا ناوی پارچەو ئەو خانەیەی بۆی دەجوڵێت بەس نییە بۆ هێماکاری، وەک لە نمونەکەی سەرەوە بینیمان کاتێ دوو سەرباز توانای خواردنی ئەسپ یان هەبوو لە جوڵەی چوارەم، بۆ ئەوەی جوانتر تێبگەین با سەرنجی ئەم نمونەیە بدەین:



لەم وێنەیەوە گەر قەڵا جوڵا بۆ d1 و لە هێماکاریدا نوسرا Rd1، ئێمە چۆن بزانین کام قەڵایە جوڵاوە؟! بۆ ئەوەی بە دوربین لە ناڕونی لەوبارودۆخانەی کە هێماکاری ئاسایی ناڕون دەبێت ئێمە پیت یان ژمارە زیاد دەکەین بۆ هێماکاری بۆ ڕوونبوونی جوڵەکە.
لێرە دەتوانین لە هێماکاریدا بنوسین Rad1، دەکرێ ببێتە پرسیار لەلات بۆ پیت زیادکرا بۆ ژمارەکە زیاد نەکرا؟ وەڵامەکە ئاسانە، لەبەر ئەوەی هەردوو قەڵاکە لەسەر یەک ڕیزی ئاسۆین گەر ژمارەی ڕیزە ئاسۆییەکە زیادکەین دووبارە ئێمە بە ناڕونی هێماکاریمان کردووە بەڵام قەڵاکان لەسەر یەک ڕیزی ستونی نین بۆیە ئێمە پیتی ڕیزە ستونیەکان زیاد دەکەین.
(هەرکات پارچەکان لە باری نارونیدا لەسەر یەک ڕیزی ئاسۆیی بون ئێمە ناوی ڕیزی ستونیەکە(پیت) زیاد دەکەین، وە ئەگەر پارچەکان لەسەر یەک ڕیزی ستونی بوون ئێمە ناوی ڕیزە ئاسۆیەکە(ژمارە) زیاد دەکەین).

کاتێک سەربازێک خواردنێک ئەنجام دەدات، هەمووکات ناوی ڕیزە ستونیە ڕەسەنەکەی لەخۆدەگرێت، وەک fxe4 و gxf6.

## ئامانجی شەترەنج چییە؟

شەترەنج یاریەکە لە نێوان دوو کەسی بەرامبەریەک دەکرێت لەسەر تەختەیەک کە64 خانەی دوو ڕەنگی یەک لەدوای یەک. هەر یاریزانێک 16 پارچەی هەیە: 1 پاشا، 1 شاژن، 2 قەڵا، 2 فیل، 2 ئەسپ، وە 8 سەرباز.













ئامانجی یاریەکە کش-مات کردنی پاشایە. کش-مات کەتێک ڕوودەدات کە پاشا لە شوێنێکبێت کە بخورێت(لەناوبچێت) (لە هێرشدابێت) وە نەتوانێت دەربازی ببێت لەو خواردنە (هێرشە).

**گەر تۆ ئەم زانیاریانەی سەرەوەت زانی کەواتە تۆ ئامادەی بۆ یاریکردن**

**هیوادارم ئەم پەڕە ئەلیکترۆنیە وەرگێردراوە ببێتە سەرچاوەیەک بۆ فێربوونی ئەوانەی ئارەزووی شەترەنج دەکەن و سەرچاوەیەکی کوردی و شوێنێکیان دەستنەکەوتووە تا بە خولیاکەیان بگەن.**

**لەهەر هەڵەو کەموکورتیەک بمبورن و ئەم پەڕاوە دەوڵەمەند بکەن بە ڕەخنە و پێشنیارەکانتان، یاخود ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵانەی من کردوومە. بەم ئیمەیلە ئاگادارم کەنەوە (bakhawan.mohammed@gmail.com)**